# مریەم خان

بەشی یەکەم

کۆکردنەوەو توێژینەوە

جەلال مەلا حەسەن خۆشناو

بەشی دووەم

کۆکردنەوەو بە نۆتەکردن و نووسینەوەی دەق

جەنگی جەلال مەلا حەسەن

پێداچوونەوەی

د. محەمەد عەزیز زازا

**سەرنج:**

**بێگومان هیچ کتێب و نووسینێکی زانستی بەدەر نابێ لە کۆمەڵێ هەڵە و بەسەرچوون و لەبیرکردن، بۆیە هەچ زانیاریەکی سەبارەت بە (مریەم خان) لەلای هەر کەسێ هەبێ بە شانازیەوە وەریدەگرین و ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکەین. تکایە بەم ناونیشانە بەسەرمان بکەنەوە.**


**Jangy – Jalal@hotmail.com**
**Jangy – Jalal@yahoo.com**
**مۆبایل: ٠٧٥٠٤٥١٢١٣٠**



**ناوی کتێب: مریەم خان**

**کۆکردنەوەو توێژینەوە: جەلال مەلا حەسەن خۆشناو**

**کۆکردنەوەو بە نۆتەکردن و نووسینەوەی دەق: جەنگی جەلال مەلا حەسەن**

**پێداچوونەوەی: د.محەمەد زازا**

**دەرهێنانی هونەری: شنۆ خدر رەسول**

**دیزاینی بەرگ: ئاسۆ مام زادە**

**تایپ: جەلیل عەبدولواحید بۆتانی**

**زمانەوانی: تاریق سالّح**

**هەڵەچن: بەناز عەلی**

**سەرپەرشتی چاپ: عیماد رەشید پیرداود**

**چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٦/هەولێر**

**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**

**چاپخانەی کشتوکاڵ**

**لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٩٦٥) ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ**

## پێشکەشە بە

- ڕۆحی دایک و باوکی میهرەبانم.

یەکەمیان: هەموو ژیانی خۆی بەخشیە پێگەیاندم.

دووەمیان: لە قەڵەم و چاو نەترسی ئەو فێر بووم،

چۆن بچمە نێو دونیای گەورەی نووسینەوە.

# ناوەڕۆک

# بەرایی

د. محمد عزيز زازا

ئـەم كتێبـەی، كـە ئێـستا ڕۆشـنایی دەبینـێ و لەبـەر دەسـتتاندایە، لـە ئاكـامی ئـەو ماندووبوونـە گەورەیەی، كە (جەنگی جـەلال)ی لێكۆڵـەری گـەنج تـوانی بەدەسـت بێنـێ و دواتـر ئـەم گەنجینەیـەی لێكەوتەوە.

لە دەسـپێكدا تـوانی ئـەو بابەتـە سـەرەتاییانە كۆبكاتـەوە، كـە بـە ئاسـانی لـە كوردسـتان وەچـنگ دەكەون وەكو بەشی هەرە زۆری ئەو گۆرانییانەی كە لە دووتوێی ئـەم پەرتووكـەدا هـەن، دواتـر ئـەو توێژینەوەو پەرەگرافانەی كەلە گۆڤارو ڕۆژنامەكانی كوردی بلاّوكرابوونـەوە لەسـەر ئـەم بەرهەمـەو لــە كۆتــایی گەڕانەكەشــیدا ئــەو چــاوپێكەوتنانەی كۆكردۆتــەوە، كــە لەلایــەن ئارەزوومەنــدان و هـەوادارانی موزیـك و گـۆرانی كـوردی كـراون، كـە بـە درێـژایی تەمـەنی ژیانیـان و لـە ئاسـتەنگترین بارودۆخی ژیانی سیاسی و ئـابووری و كۆمەلاّیەتیـشیان لـەم ڕۆڵـە پیرۆزەیانـدا كـەوتوون و بەسـەدان قەوانی كۆن (فۆنۆگراف) یان كە لە بەرهەمهێنانی كۆمپانیـا هونەرییـە دانـسقەكان وەك (كۆمپانیـای بەیزافۆن) توانیان ئەم بەرهەمە دانسقانە بە شانازییەوە لە ئاهی ڕۆژگار بپارێزن.

بەدەر لەو گۆڕانكارییە هونەری و كۆمەلاّیەتی و سیاسیانەی كەلە ئاكامی كۆتاییدا هەر هـەموویان دژی ڕەوتی هونەرو كلتوری كوردی بوون!! ئەمەش بێگومان لە ئاكامی ئەو ڕەفتارە شـۆڤێنیانەو ئـەو هەلّوێستەی دەسـەلاّتی ناوەنـدی كەلـەپوچ بـوو بەرامبـەر بـە گـەلی كـورد و هونـەرو كلتورەكـەی ئـەو هەلّوێست و سیاسـەتانەی كەلـە سایەی دەسـەلاّتی ڕژێمـی (سـەدام)ی گـۆڕ بـە گـۆڕ گەیـشتە تـرۆپكی داپلۆسێنـەرانەی خۆی، كەبووە هۆی ئەوەی ئەو كۆمپانیا بەرهەمهێنـەرانەی كـە پـرۆسـەی فرۆشـتن و بلاّوكردنەوەی قەوانەكانی عەرەبی لە ئەستۆ دەگرن لـە شـارێكی وەكـو (موسـڵ) لەزگـەی چـاپكراوی قەڵب لەسەر قەوانەكانی (كاوێس ئاغا) و (حەسەنی جەزیری) و (مریەم خان) بدەن. ئەم لەزگانـەی لەسـەر قەوانـەكان درابـوون وا پیـشانی دەدا كـە ئـەم قەوانانـە هـی (ئـوم كەلـسوم)ن!! مەبەسـت لـەم كـارەش ئـەوە بـوو، كـە ئـەم بەرهەمـە گرنگانـە لـە فـەوتان و لـە ناوچـوون و دەستبەسـەرداگرتندا بیانپارێزن، كە لەلایەن لیژنە فەرمییـە تایبەتمەنـدەكان ئـەنجام دەدرا، چـونكە پیـشەی ئـەم لیژنانـە تەنها بۆ ئەوە بوو كە دارمانێكی هونەری و فیكری بەسەر كلتوری كوردیـدا بـسەپێنـێ[1] وەكـو ئـەوەی كە لە ناو خۆماندا باوە (شەلم كۆرم ناپارێزم).

---

[1] – ئیسنتیوتی كەلەپوری كوردستان لە هەولێر پێش چەند مانگێك لە بازرگانێكی شاری موسڵ زیاتر لە (١٠٠) قەوانی كڕی، كە هەر هەموویان لەزگەی چاپكراوی ڕوون و ئاشكرایان لێدرابوو، كە گوایە ئەوانە هەمووی قەوانی (ئـوم كەڵـسوم)ن!!! بـەلاّم لـەكاتی گوێبیـستی ناوەڕۆكەكـەی وەك ئەفـسووس گوێبیـستی ناسـكترین گـۆرانی سترانبێژە پایە بەرزەكانی كەلتووری كوردی وەك(مریەم خان ، كاوێس ئاغا، حەسەن زیرەك ...هتد) دەبووین.

(جـەنگی جـەلال)ی، لێکۆڵـەر، کۆمـەڵێکی زۆری ئـەم قەوانانـەی وا کۆکردنەتـەوەو تیایـدا کـات و خوێندن و خەرجیەکی زۆری تیاچووە، بەڵام ئەو پاڵنەرە بەهێزەی، کە سەرچاوەی لە درك پێکـردن و ڕێزگرتنی هونـەری بـەرز بـۆ فۆلکلۆرییـەکی کـە لەلایـەن (جـەنگی)یـەوە هـەبووەو هـەروەها وەکـو فێرخواز و ژەنیارێکی دیار لە قۆناغی سێیەمی بەشی موزیکی کۆلیژی هونەرەجوانـەکان لـە هـەولێر خۆشی لەناو بنەماڵەیەکی ڕوناکبیر و کەلتوورخوازدا چەکەرەی کـردووەو بۆیـە هـەر ئـەوان دەزانـن، درك بـە گـەوەریی و ڕۆڵـی هونـەر و کـەلتووری کـوردی بکـەن، بۆیـە وەکـو کـارێکی ئاسـایی ئـەم خۆشەویـستەی بنەماڵەکـەی قۆنـاغ بـە قۆنـاغ گواسـتراوەتەوە تـا گەیـشتووتە(جـەنگی) ئەمـەکخواز. ماموٚستا(جەلال خۆشناو)ی، باوکی لێکۆڵەرێکی بەزەبرو کۆکەرەوەیەکی بە سەلیقەی بـواری مـوزیکی کەلەپووری کوردییە، چێژ هەڵگرێکی تۆکمەی دیاری بوارەکەیـەتی.(جـەلال خۆشـناو) خـاوەن دەیـان نووسین و توێژینەوەی هونەریە لەسەر موزیك و گۆرانی کوردی لەوانـە هـەردوو کتـێبی(سـێ بـەیتی فۆلکلۆری کوردی ـــ لاوك) و (کاوێس ئاغا) ئەم سەلیقەییی پەروەردەکارییە بوونە هۆکـارێکی گـەورە بـۆ ئـەوەی بـە دیکـۆمێنتی مێـژوویی و هونـەری کـاروانی ژیـان و هونـەری(مریـەم خـان)ی گـەورە گورانیبێژی کوردی بەناوبانگ ڕۆشنایی ببینێ! ئەو ژیانەی کە پڕ بووە لـە خۆشـی و ناخۆشـی، تـاڵی شیرینی هەروەها لە دوو توێی ئەم کتێبە کۆمـەڵێك لـە (دەق و نۆتـەی مـوزیکی)بـۆ کۆمـەڵێ گـۆرانی بەناوبانگ و لەبیر کراو دیار نەماو. بۆیە ئەم کتێبەی کە لەبەر دەستتاندایە هەرچـەندە بـە قـەبارە بچووکە بەڵام لەناوەڕۆکدا زۆر بە بەهایە و بە شانازییەوە ئینستیوتی کەلەپوری موزیکی کوردسـتان دەیخاتە نێو خەرمانی ئەو کتێبانەی کە مانگانە دەریدەکات.

لێـرەدا پێویـستە ئامـاژە بـەو ئاسـتەنگانە بکـەین، کـە لەبـەر دەم هـەر نۆتـە نووسـێکی گۆرانییـە فۆلکلۆرییەکان و هونەرە میللییە سەرزارەکییەکان دروست دەبن، ئەم ئاسـتەنگانە، کـە ئاماژەیـان پـێ دەکرێ لە بەشێك وەك لە هەموو ئەو کتێبە نوێیانـەی کەچاپ دەکرێن یـاخود لـە هـەر ژمارەیـەکی نـوێ لـە گۆڤـاری مانگانـەی (چـلاواز)ی، مـوزیکی. ئاسـتەنگی یەکـەم دیـاریکردنی (تیمپـۆ و ڕزمـە) تایبەتیەکانی هەندێ لە گۆرانییە دیارەکانە هـەروەها ڕێگاکـانی نووسـینەوەی نۆتـەی ئـەو ئاوازانـەی

---

بۆیە ئێمەش لێمان پرسی بۆچی بەم شێوەیە (نووسەکی) ساختەتان لەسەر ئەم قەوانانە داوە، وەك پێشتریش روونمـان کردۆتـەوە، یەکسەر لەوەلامـدا وتـی مـن لەگـەڵ هاورێکـانم لـەم کـارە مەبەسـت و ئامانجمـان هـەڵگرتن و پاراسـتنی (سـەر و سـامانی ـــ کـورد)ە لـە، لـەناوبردن و تـەفروتوناکردن و دەستبەسـەراگرتنی لەلایـەن پیـاوانی دارودەستەی(سەدام).

ئێستا بۆ مێژوو بەشێك لەم قەوانانـەی، کـە لەزگـەی چاپکراوی ساختەی لەسـەرەو، بـۆ دادگـایکردنی هەڵوێـستی سیاسی فاشستی بەعسیەکان کە لەلایەن(سەدام)و دارودەستەکەی پەیرەو دەکرا هەڵگیراوە لە بەشـی (ئەرشـیف و توێژینەوە) لەلامان و ئەمە لەلایەك، لە لایەکی تر پەیوەستە بە بەم بابەتـە، هـەر کەسـێك سـەردانی شـاری کـەرکوك بکات زیاتر دڕەندەیی بەعسییەکان بە چاوی خۆی دەبینێ، بە تایبەتی ئەو وێرانکارییـەی، کـە بەسـەر قەڵایەکـەی هاتووە، کە بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو مەبەستیان لەناوچوون و تـەفروتوناکردنی ئـەو قەڵایـە بـووە بـە داخـەوە شـتێکی وای لێنـەماوە شـایەنی باسـکردن بـێ! تـەنها لـە وێنـە فۆتۆگرافیـەکان دەزانـرێ کـە ئەمـە قـەڵای کـۆنی (کەرکوك)ە.

که نەخشە دارن و بە چەندین شێواز لەنێو یەك گۆرانیدا دووبارە دەبنەوە، کەچی هەمان ماناش دەبەخشن و دەبنە هۆی ئەوەی کە مۆرکی(ئیرتجال) (گوتنی ڕەها)مان بەسەر بسەپێ ئەمەش بێگومان وا لە گوێگر دەکا، کە تەنها بیر لەو ستایلە بکاتە: بێگومان ئەم (ئیرتجال)ەش، لە گۆرانیبێژێك بۆ گۆرانیبێژێکی تر لە گۆڕاندایە بە شێوەیەك کە دیاریکردنەکەی ڕەزم و ئاوازەکان لەکاتی نووسینەوەیاندا بەنۆتە پتر نزیك دەبێتەوە لە میلۆدییەکی فۆلکلۆری هەروەها لێرەدا ئەدای گۆرانی بێژیش ڕەچاویەکی تەواو بەخۆ دەبینێ. باشترین نموونەش بۆ ئەمە گۆرانی(زەمبیل فرۆش)ە، ئەم گۆرانیە لەسەر ئاستی هەموو پارچەکانی کوردستان ناسراوە بەوەی کە ڕەزمێکی (٨) گوڵشەینی هەیە. بەڵام ئەم گۆرانیە لەلای مریەم خان بە مۆرکێکی ریستایتفی لیرکی دەق ئاوازداری نزیك لە گوتنی ئیرتجالی ئادا کراو مۆرکێکی خەماوی و چێژداری گەورە بەخۆیەوە هەڵدەگرێ وەکو ئەوەی داوای بەهاناوەهاتن بکات، کۆمەڵێ ئاستەنگی تریش هەمدیس لەبەر دەم هەریەکێ لەنۆتە نووسی گۆرانییە فۆلکلۆریەکاندا هەیە، وەکو زاڵبوونی ئادای ئامێرەکانی موزیکی بەسەر ئادای گۆرانیبێژ لەکاتی نووسینەوەی نۆتەکان کە بێگومان دەبێتەهۆی ئەوەی کۆمەڵێ دەنگی ئاوازداری یەك بەدوایەکهاتوو ببیستین، کە هەندێ کەوانەی بەیەکەوە بەستن کۆیان دەکاتەوە بۆ ئەوەی گوزارشت لەدرێژکردنەوەی ئاوازداری پیتە دەنگییەکان بکات. هەروەها زاڵبوونی هزری موزیکیی نۆتەنووس بەسەر بابەتەکە وەکو ئەوەی کە نۆتە نووس بۆ چەندین ساڵە گۆرانیەکەی ئەزبەر کردووە بۆیە کاتێ دەست بە نووسینەوەی گۆرانیەکە دەکا وا دەیکا بەنۆتەی موزیك، کە خۆی ئەزبەری کردووەو دەیزانێ نەوەك وەکو ئەو بینووسێتەوە کە گۆرانیبێژەکە لەبەردەمیدا دەیڵێ یاخود بە تۆمارکراوی گوێبیستی دەبێ.

کۆمەڵێ ڕۆشنایی تر هەن دەکرێ بخرێنە سەر لایەنەکانی ژیانی تایبەتی(مریەم خان)و ئەو تیپە موزیکیانەی کە هاوشانی بوونە. هەروەها ئەو بارودۆخەی کە هەندێ لە گۆرانیەکانی تیادا تۆمار کراوەو چالاکییەکانی تیادا نواندووە هەروەها چۆن بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگای کوردەواری هەڵوێستیان بەرامبەر بە ئافرەت بە گشتی و(مریەم خان)یش بە تایبەتی وەرگرتووە بۆ ئەوەی سنورێك بۆ داهێنانی شاژنی هونەری گۆرانی کوردی دا بنێت. ئەو داهێنانەی (مریەم خان)ئەگەر بارودۆخەکە لەباربوایە دەکرا هونەری گۆرانی میللی کوردی ئاستێکی بەرزتری هەبوایە و ئاسۆیەکی بەرینتریشی داگیربکردبوایە، بەڵام لەبەر هەندێ هۆکاری بابەت ئامێز و تایبەتی نەکرا ڕۆشنایی داهێنەرانە ببینێ.

ئەم کتێبە لەتەك کتێب و توێژینەوەکانی تری کە لە ئایندەدا چاپ دەکرێن پەردە لەسەر کۆمەڵێکی تری ئەو داهێنەرانەی بواری گۆرانی کوردی ڕەسەن لادەدات و دەبێتە هۆکارێکی سەرەکیش بۆ دانانی بەردی بناغەی توێژینەوەی زانستی موزیکی لە کوردستان.

د. محمد عزيز زازا
بەرپرسی بەشی توێژنەوەو لێکۆڵینەوە
لە ئینستیوتی کەلەپوری کوردستان
هەولێر ــ کوردستانی عێراق

# ڕوونكردنەوەیەك لە نزیكەوە

موسا أحمد

مامۆستایەكی ڕێك پۆش بوو بە جل و بەرگێكی هەژارانە كە دەتبینی هەستت دەكرد بە دوای شتێكدا دەگەڕێ، بەردەوام زانیاری لە بارەی وشەكان وەردەگرت، شەیدای كۆكردنەوەی ژیانی هونەرمەندانی میللی گەلەكەمان بوو، وای دەزانی خوای گەورە لەسەری واجب كردووە كە دەبێ كەلەپوری میللەتێكی زوڵم لێكراوی دابەشكراوی بە تورك و فارس و عەرەب كراو كۆبكاتەوە.

ئەو ڕەچاوی هیچ سنورێكی نەدەكرد، چونكە بڕوای تەواوی بە دەست كردی ئەو سنورانە هەبوو "كاوێس" كوردە لە جەزیری بۆتان و وان بێ لە قامشلو عەموود بێ لە سلماس و كرماشان بێ لە ئامێدی و لە سۆران بێ دەبێ لاوك و بەستەكانی كۆبكرێتەوە، شیبكرێتەوە هەروەها دەبێ فەرهەنگۆكێكیشی پێەوە بلەكێنرێ تا ئێمە مانان دەوڵەمەندی زمانەكەمان بزانین و قەدر و ڕێزی پارێزەرەكانیشی بگرین.

خۆ مریەم خان و سەید عەلی ئەزخەری و نەسرین و ڕەشوڵ و حەسەن حەیران ... هتد، لە پێشەنگی زمان پارێزان و مێژوو پارێزان تۆرە پارێزان تەنانەت جوگرافی پارێزان، بەمەش كورد پارێزان بوون، ئەرێ چونكە پەرتوكەگران بەهاكانمان، مێژوومان، لەسایەی سەری برایانی عەرەب و فارس و تورك كۆدەكراو هەڵدەگیرا!! لە كوێ؟ لەنیو گڕی ئاگردا.

ئیترئەرشیف خانەكانمان بوونە قەفەسی سینەكانمان، بە ئاوازكردنیشیان ئامرازێكی هەرەباش بوو بۆ گواستنەوەیان لە یەكێك بۆ یەكێكی تر.

لاوكیش كە بە شەعراندنی لە كوڵ كردینەوە، ئیتر سەری لاوكەكە بەڕووداوێك دەستی پێدەكردو تاكۆتایی بەو "میرخاسیە، كارەساتە، پەیوەندی دوو عاشقە" دەهات بەمەش ئارشیف دەكراو لە دەڤەرێكەوە بۆ دەڤەرێكی تر بەڕێ دەكرا، بەڵێ ئیتر وەك ئامانەتێكی گەورەو موقەدەس لە سینێكەوە بۆ سینەیەكی تر دەگوازرانەوە.

دەنا ئەوانیش چارەنووسیان لە چارەنووسی ئەو هەموو پەرتوكخانە گەورانەی شاو میرزاناكانی كوردەكان باشتر نەدەبوو كە ئێستا هیچ ئاسەوارێكیان نەماوە، وەك مێژووش

دەڵـێ سـەردەمانێك مـیری کـورد هـەبوون کـە گـەورەترین پەرتوکخانـەیان لـە کۆچـکەکانیاندا دروست کردبوون.

بەڵێ لە خۆڕا نەبوو حاجی جندی و جەلیلی جەلیل ...هتد بۆ بنیاتنانەوەی مێـژوو زمـان و ئەدەبی کوردی لە ئێرەڤانی سەردەمی سۆڤیەتستاندا یەکەم هەنگاویان بە کۆکردنەوەو شرۆڤە کردنی "کـەلامێن کـوردا" دەسـت پێکـرد، کـە بـەلای ئەوانـەوە باشـترین سەرچاوەی دەسـتکاری نـەکراو بـوون تەنانـەت هەریـەکێکی ئاسـتی کۆمەلایـەتی ئـەو کـاتی کوردسـتانیـشی بەرجەسـتە دەکرد.

ئەوە نییە کۆنفوشیوس دەڵێ: بەر لەوەیی میللەتێك بناسی هونەرەکەی بناسە، فەلسەفەی ئـەم گوتەیـە بـۆ گـەلانی لـە شـێوەی ئێمـە زیـاتر جێـی خـۆی دەگـرێ ئێمـە چـمان مـابوو، چیان هێشتبوو تا پێیەوە بناسرێنەوە لـە هونـەری گـۆرانی زیـاتر رەنـگ و روخساری ئێمـەی پێـوەی دیار مابێ، ستران، گۆرانی، لاڤژە، لاوك، بەستە، حـەیران، بـەیت، هـۆرە، ئەلاویـسی، ئـای ئـای، قـەتار، سیاچـەمانە، چـەمبەری لاواندنـەوەکانمان هـەمووی لـە کـاتی خۆشـی و ناخۆشـیدا سەرەڕای هەموو ئەولایەنە پۆزەتیڤانەی ئیشارەتمان پێدان بۆ هێورکردنەوەی دەرونیش دەکار براون، هـەر بۆیەشـە ڕیـز لـە بێـژەرانی گـیراوە" پاشـا و خـان و ئاغـا و کیوێخـا و بـەگ و مـیر و ماقولـەکانمان لـە پـاڵ وەزیـر و گزیـر و مـیرزا و داناکانیانـدا هـەڵگرانی ئـەو بـەهرە خوداییـەش دەبوایە هەبوان.

سەختە بۆ من باسی دەرهاویشتە ئەرەنیەکانی فلکلۆری کوردی بکەم، منێکی کۆڵـەوار لـەم مەیدانە فراوانەدا چۆن لە پێشەکیەکی بچوکدا بچینە نێو ئەو هەموو فەلەسەفە و سـتاتیکایەی کە لەنێو ڕستەکانی کەلامی کوردیدا شاردرانەوە، بەڵام کە ئەم بەرهەمەم خوێندەوەو دەستم بە نوسـینەوەی ئـەم رسـتانە کـرد، بـەردەوام هەسـتم دەکـرد سـێبەرێك لەسـەرمە بۆیـەش خـۆم ئازاردەدا تا ووشە گەلێك لە نوویکی قەلەمەکەمەوە بزێن شایستەی ماندوو بوونی مامۆسـتا بن.

ئێستا "پیرێك"دێتەوە یادم هەرکە دەیبینیم دەی گوت مامت چۆنە هەندێ وشەم لـێ ئاسـێ بوونە دەبێ بیبینم تا واتاکان لە زاری ئەویش ببیستم، مامۆستایەکی ماندووم لێوە دیـارە کـە بیری لە هەموو شتێ دەکردەوەو تەنیا مـردن نـەبێ! ئـەویش نـەك لەبـەر بڕوابوون بـە جەسـتەی خۆی، چونکە جەستەیەکی لاواز و پڕ لە ئازاری هەبوو، بەڵکو لەبەر ئـەوەی کـە دەیزانـی مـردن دای دەبـڕێنی لـە خۆشەویـستانی لـە هێڤییـەکانی. مـردن دای دەبـڕێنی لـە بەرنامـەکانی و پرۆژەکانی بەنیوەڕۆی بەجێی دەهێڵی.

تەنیا هەفتەیەك دەبوو بەر لەوەی ماڵ ئاواییمان لێبکات، شـەوێك چـوومە خزمـەتی وێـرای ئەوەی جارێکی تر وێستگەکانی ژیانی خۆی بۆ گێڕامەوە، باسی ئەو بەرهەمەشمانکرد گوتی:

که چاتر بووم گەڕانێکی باش دەکەم تا هەموو بەرهەمە و ژیانی مریەم خان تەواو دەکەم، کە پێم گوت بەڵێن بێ بەرهەمەکەت بە شێوەیەکی جوان چاپ بکەین زۆر دڵخۆش بوو، کاك جەنگی گوتی: شەوانی تر ئەو کاتانە تەنیا ناڵە ناڵی بوو، بەڵام ئێستا دەڵێن هەر نەخۆش نییە.

دڵنیام خۆشی لە چاپ دانی بەرهەمەکەی ئازارە بە ئازارەکانی لەیاد بردبوەوە، هەر ئەو شەوە پێم گوت: بەرهەمێکت لە گۆڤاری شەفەقی نوێ بڵاوکرایتەوە، گوتی: نەم دیوە؟، کاك جەنگی دەی گوت: لەدوا کاتژمێرەکانی ژیانی ئاگای لەخۆ نەبوو ناوی هەندێ کەسی دێنا لە ژیاندا نەمابوون، جارێك گوتی: موسا گۆڤارەکەی بۆ نەهێناوم، ئەمە پەرۆشی مامۆستا بوو بۆ بەرهەمەکانی بە ڕاستی وەك کۆرپەکانی تێدەڕوانین، دەمانزانی ئەو بەرهەمەی بۆ تەواو ناکرێ لێ من نەم دەزانی جەنگی بەو دڵسۆزیەو ئەمەکداریەوە ئارەزووکەی باوکی دێنێتەجێ. دڵنیام ئەو روحی شادەو بەم بەرهەمەش ڕوحی شادتر دەبێ، ئەونییە وەك جەنگی دەی گێڕێتەوە دوای مردنیشی هەر سۆراخی بەرهەمەکەی دەکات.

ڕوحت شادبێ مامۆستا گیان...

موسا أحمد

# "مریەم خان" کانیاوی میلۆدی

ئامانج غازی

لەنێو جەستەی شەکەتی میللەتێك، رۆحێکی بە ورو پڕ جەسارەت دەنگی هەزارەها بێدەنگەکان لە کۆڵ بنێ، ئەمەیان خۆی لە خۆیدا شۆڕشێکە، لە کازیوەی ئاوازە کوردییەکان، ئەو ئاوازانەی بە ڕواڵەت و سیماو ناوەڕۆکەوە دەگەڵ مرۆڤی کورددا دەژیێن، تەنها ئەوانە بە نەمری دەمێنینەوە، کە خاوەن ڕابردوویێکی ئەمڕۆ بە دەستن!! "مریەم خان" شۆڕە ژنی پێشەنگی دەنگهەڵبرینی بێ پسانەوەی ئاوازە ڕەسەنەکان هەر زوو دەرکی بەوەکردبوو، کە ئاوازی هەستان و بێ ڕیتم (Adlib) خۆی لە خۆیدا ڕەزمێکی ئەزەلی هەیە، کە هەمیشە بە نێو ناخی میللەتدا ڕۆدەچێ، بۆیە سەردوولکە و بەیت و بالۆرەو لاوکی سۆزداری قارەمانێتی، کە هەوێنی شاکارەکانیەتی لەگەڵ بەستەو میلۆدییە ئاوازدارەکان دوو کۆڵەگەی گرنگ و گرانبەهای هونەری ئەم ئافرەتە کۆڵنەدەرەن!! ئاداو وتنی (مریەم خان) بۆ ئەو میلۆدییانەی، کە چڕیویەتی گۆڕانکاری گەورە لە بەرزی و نزمی و ئەپۆجیاتوورە موزیکییەکان بەخۆوە دەگرێ، بە مانایەکی تر هەر کە دەقی شیعری یان چامەی لاوکەکە پێویستی بە دەربڕینی پتر و هەناسە سواری زێتری کەسایەتیەکان دەربڕێ ئەم قۆڵتر دەچێتە نێو ناخی میلۆدییەکان و هەڵبژاردنی سکێڵی ئاوازەکانیش بەپێی جوگرافیا و مێژوو و ژینگە و بارودۆخی نالەباری ئەو سەردەم بووە، کە بە ڕای ئێمە ئەم خاڵە پێویستە هەڵوەستەی هونەری لەسەر بکرێ!!
(مریەم خان) توانیویەتی لە چینە دەنگی (سوپرانۆ) هەندێ شاکاری جوانمان پێ بناسێنێ.

لەگەڵ ئەمەشدا زۆر بە وریایی مامەڵەی لەگەڵ موزیکژەنەکاندا کردووە، نەبادا ئەو هەست و سۆز و پەروەردەکردنە ڕەسەنەی، کە لە نێو ژینگە پاکەکەی وەریگرتووە، بە شنەبای ئاوازێکی نامۆ بە هەدەر بڕوا، بۆیە هەمیشە ئێمەی هونەرمەندان هەست بەوە دەکەین، کە تا (مریەم خان) زنجیرەی ئاواز و میلۆدییەکان تەواو نەکا بوار، بە هیچ موزیکژەنێك نادا تێکەڵی دەنگی ئەو بێ. بۆ ئەوەی ئەو بابەتەو مەرامەی ئەو هەیەتی بەو هەیبەتە هونەرییە بگاتە بیسەر، کە خۆی مەبەستیەتی. لە هەردوو پلە دەنگی (سۆل) و (لا) داو هەندێ جاریش لە هەردوو پلە دەنگی سەرووتر (سی b و دۆ)دا گەیشتۆتە لوتکەی ئەفراندنی پێویست لەو

سەردەمەدا، لە تەجویدی پیتەکاندا زۆر ئازایانە نەپساوەیی دەنگی خۆی کردۆتە پردێك بۆ ئەوەی مۆرکێکی ڕەسەن و تایبەت بداتە میلۆدییەکان، لە مەقامی (بەیات)دا هەست دەکەیت ئەو چارەگە دەنگە، کە بە (کۆما) لەگەڵ گشت چارەگە دەنگەکانی مەقامی (بەیات) لەلایەن (عەرەب و فارس و تورك)دا جیاوازەو بەرزترە لەلایەن (مریەم خان)ەوە کوردانددوویەتی، ئەمەش ئەو ڕارایی و دڵەڕاوکێیەمان لەلا دەرەوێنتەوە، کە گەلانی دراوسێ بە کورد دەمێکە ویستویانە نەژاد و داهێنانی ئەم مەقامە لە (کورد) زەوت بکەن!!(مریەم خان) لە ئەدای بابەتەکانیدا زۆرینەی جارەکان (ئۆکتاڤ)ێکی بەزاندووەو هەست و گوێچکەی پڕ مەعریفەتی هونەری خۆی بە جۆرێك لەگەڵ (Tempo)ی گۆڕانیەکاندا ئاوێتە کردووە، کە بەهیچ شێوەیەك هەست بە دابڕان یاخود لەنگیەك لەکاتی چڕینی ئاوازەکاندا ناکەیت، بۆیە تۆکمەیی هونەری (مریەم خان) شایستەی ئەوەیە کە وەکو قۆناغێکی گرنگی هونەری گۆرانی کوردی سەیر بکرێ و توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی پتری لەسەر بکرێ و چینە دەنگی(میزۆپرانش) کە تایبەتمەندی و گۆڕانکاری مەزنی لەسەر بونیاتنراوە وەکو خاسیەت و چڕین بە شێوازێکی کلاسیکیانەی پایەدار مامەڵەی لەگەڵدا کردووە بە شێوەیەك (میزۆسوپرانۆ)پردێکی هەمیشەییە بۆ داهێنان لە (سوپرانۆ)و گەیشتن بە لوتکەی ئادا لە چینە دەنگی (ئاڵتۆ).

**ئامانج غازی**

# ئاغا و خان

له کۆمپانییەکان ناز ناوی (ئاغا و خانیان) بۆ هونەرمەندان هەڵبژارد که ئەو کات باو بوو، هەروا بۆ ڕێزلێنان لە هونەرمەندان، ئەو دوو ناوەیان پێ لکاندن وەك وشەی (ئاغا) بە هونەرمەندی پیاویان دەگوت: ئاغا، وەك(کاوێس ئاغا، سەعید ئاغا جەزیری، حەمەد ئاغا مەندۆ، شەریف ئاغای ژن، عەزیز ئاغای قەوان، هەروا بە هونەرمەندی ئافرەتیشیان دەگوت (خان) وەك (مریەم خان، گولی خان، منجیٚ خان، ئەلماس خان)...هتد. ئەوەی شایانی باسە تا ئێستاش لە زۆر شوێن لە کوردستاندا ئەم دوو وشەیە باون وەك لە شاری ڕواندوز و سلێمانی که زۆربەیان خان، یا ئاغا ناز ناویتیان.

ئەو کۆمپانیانەی که (میریەم خان) گۆرانییەکانی لیٚ تۆمار کردوون ئەمانەن:—

١. کۆمپانیای (ئەبو کەلب) .
٢. کۆمپانیای (کۆلۆمبیا) .
٣. کۆمپانیای (ئۆدیون) .
٤. کۆمپانیای (بێزافون) .

که میریەم خان دەستی کرد بە تۆمار کردنی گۆرانییەکانی لە بەغدا جێگیر بوو، پەیوەندی لەگەڵ (حەسۆ جەزیری،مەحەمەد عارف جەزیری، دایکی جەمال، ست ئەلماس، ڕەمەزان جەزیری، خەلیل ئاکرەیی، عەزیز ئاغای قەوان، پەیدا کرد، تا دوای ژیانی هەر لە بەغدا مایەوە، هەریەکە لە هەڤاڵ و هۆگرەکانی بە جۆریٚ یادگارییەکانی لەگەڵ مریەم خان دەگێڕێتەوە، بەڵام بە ڕای من ئەوەی ڕاستبیٚ نهێنییەکانی ئەم ئافرەتە ئاوارەو لیٚ قەوماوەو دڵ لە ئاخ و داخ تاکو ئێستا زۆر لایەنی لەسەربردەو بەسەرهاتدا ڕوون نەبووتەوەو پێویستی بە گەڕانی مەیدانی و ماندوو بوون هەیە.

مریەم خان هەر لە منداڵیەوە تووشی کەچەڵی دەبێت، ئەم دەردە لە کوردستاندا هەروا لەولاتی عەجەم و ڕۆم و ولاتی عەرەب بڵاو ببوەوە، بە هۆی نەبوونی دکتۆر و داو دەرمان لەو سەردەمانەدا، هەروا گرنگی نەدان بە پاك و خاوێنی و نەبوونی (سابون)، بەڵام ئێستاکە ئەم دەردە زۆر کەمەو بە دەگمەن ڕوو دەدات.

مریەم خان هەردەم سەری خۆی بەستیتەوە بە (لەچەك) دەبیٚ ئەوەش بڵێین هەر لە کۆنەوە تاکو ئێستاش خێڵەکانی کۆچەری لە کوردستانی ڕۆژ ئاوا و کوردستانی باکووردا هەروا لە ناوچەی (شەنگال) یاخود بڵێن زومار، یا ژەنگار ئەم سەربەستنە باوە .

# مریەم خانی هونەرمەند و بەهرەمەند

مریـەم خـان هونەرمەنـدێکی بـە توانـاو کارامـەو دڵ پـڕ لـە سـۆز بـوو، بەسـتەو لاوکـەکانی ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆچەرایەتی، خۆشەویستی و ئەڤینداری پاك و بیٚ گەرد و پڕ لە سۆزی دڵداری ڕاستەقینە، شەڕ و شۆڕ، سوار چاکی کورد، ئەمەکداری، غەریبی بەڵێن نەشکاندن، هەروا هەستی نەتەوەیی و چەوساندنەوەی میللەتی کورد بەدەر دەخات، دەنگ و ئاوازی ئەم هونـەر مەنـدە لـەناو گـشت سـاز و ئـاوازی ڕەسـەنی کـوردی دا، مـۆرکێکی تـەواوی کۆمـەڵی کوردەواری پێوە دیارە، چونکە لەنێو کۆمەڵگای کوردەواری هەڵقوڵاون و لە شەقەی باڵ دەدەن و لە چیا سەرکەشەکانی کوردستان بەرزتر دەبنەوە.

ئەگەر بێتو بە وردی بچینە ناو جیهانی ئاواز و گۆرانی ئەو هونەرمەندە لاوك زانە، هەست دەکـەین کـە دەنـگ و ئـاواز و سـەدای ئـەم ئافرەتـە دڵ پـڕ لـە سـۆزە، بۆمـان دەردەکـەویٚ و کـە گۆرانییـەکانی چ لاوك بێـت یـان بەسـتە، لـە نـاخی دڵـەی پـڕ لـە ئـازار و دەردەسـەری سـەری هەڵداوەو غـەم پـەژارەو زۆر لێکـراو، مـاف خـوراو، ئـاوارەیی، دابـڕان لـە خـزم و کـەس و کـارو خێڵەکەی، هەڵ ئەقوڵیٚ، بۆیە لاوکی کردووە بە هەڤاڵ و هۆگری خۆی تـا غـەم و کـەف و کـولی داخی دڵی پیٚ دابمرکێنێت.

مریـەم خـان کەسـایەتی خـۆی لـەناو کۆمەڵـدا چەسـپاندووە، هـەر کـە گوێـت لـە دەنگـە زوڵاڵەکەی بوو یەکسەر دەی ناسیتەوە، مریـەم خـان ڕێبـازی تایبـەتی خـۆی هەیـە لـە گـۆرانی گـوتن، تـاکو ئێـستا کـەس نـەی توانیـوە لاسـای بکاتـەوە، بـەڵام (ئایـشە شـان) کـە هـەمان کوێرەوەری چێشتووە، تا ڕادەیەك دەنگە بـە سـۆزەکەی نزیکـی چینـە دەنگـەکانی مریـەم خانـە وهەستی غوربەتیت دەجوڵێنن .

# لاوك چییه؟

لاوك، وشـەیەكی كـۆنی كوردییـە، لـە وشـەی (لاو)ی كوردییـەوە هـاتووە، (لاو) وشـەیەكی فەرهەنگییـە بـە واتـای جاحێڵ، گـەنج، یـا تـۆلاز هـاتووە، بێگومـان هـەرەتی لاویـش هـەرەتێكی تونـد و تیـژورِوو لـە گۆرانـە لـە پلەیـەكی ژیانـدا بـۆ پلەیـەكی پێشەكوتووترو بـەرزتری ژیـان دەروات.

لاوك: جـۆرە ئـەدەبێكی میللـی كـوردە كـە بـە ئـاوازێكی تایبـەتی گۆرانیبێـژ دەنگـی لـێ هەڵدەبری و هۆنراوەكانی لاوكەكە دەڵـێ، پێشەكی و پاشبەندی هـەر كۆپلەیـەك هـەموو جـار بەلاوو، لێ لێ، لۆ لۆ هەی لێ براو گەلێ خەم و شیوەن و خۆزگە و ئـاوات دەسـت پـێ دەكـات و كۆتایی دێت، یا وەكو گوتراوە (سەر و بن گرێدراوە).

بەڵام بە رای من (لاوك): ئـەو ئـاوازە بـە سـۆزەیە،هەر چـەندە دڵپـەرسـت و غـەمبار و مانـدوو بیـت، دەتحەسـێنێتەوەو خـەم و پـەژارەت لـە دڵ دەرِوێنێتـەوە، (لاوك): ئـەو دەنـگ و ئـاوازە بـە سۆز و دڵرفێنەیە كە لە گەرووی پیاو و ئافرەتی هونەرمەند لاوكبێژانی كورد دێتـە دەرێ و لـە شەقەی باڵ دەدەن و لە چیا سەر كەشەكانی كوردستان بەرزتر دەبنەوە.

لاوك: هەموو یادگارەكانی دڵداری پاك و بێ گەردت لە خۆشـی و ناخۆشـیت دێنێتـەوە یـاد و دەتباتەوە سەر دەمی لاوی بۆیە لەگەڵ لاوك ئاوێتە دەبێت.

لاوك: سـەرهەڵدان و بـەرخودان و رووداوە مێژووییـەكانی گـەلی كوردمـان وەك شـریتێكی سـینەمایی نیـشان دەداو دوژمنـانی سـەر سـەختی میللـەتی كوردمـان ریـسوا دەكـات، تـا نەوەكانمان یەك لە دوای یەك بە درێژایی مێژوو لە یادیان نەكەن.

لاوك: هەرگیزاو هەرگیز پیر نابێت، هەردەم خۆشەویسترین هەڤاڵ و هۆگرە.

لاوك: ئەو ئاوازەیە،هەردەم روو لە بەرزایی دەكات و هـۆگری دونـدو شـاخەكانەو ملكەچـی ناكات و هانت دەدا كە شاخە سەر كەشەكانی كوردستان وەك پـشت و پـەنا خـۆت تیـا حەشـار بدەیت، بۆ روو بە روو بوونەوە دژی دوژمنان و داگیركەران و دەست و پێوەندەكانیان، كەواتـە لاوك دەنگی خەڵكی چیاییەكانە، دەنگی سوار چاك و كۆمەڵگای كوردەوارییە.

لاوك: سـەربردەو ئازایـەتی و قارەمانیـەتی و سـوار چـاكی رۆڵـە ئـازاو نەبـەردەكانی گـەلی كوردمان بە دیار دەخات لە قۆناغە جۆر بە جۆرەكانی مێژووی زێرینی گەلی كوردمان.

بەڵێ... تا كورد ماوە، لاوك ماوە، تا چیا ماوە، لاوك ماوەو نامرێت.

# چییان له بارەی (مریەم خان) نووسیوە؟...

ئەو بـرا نووسـەر و فۆلکلۆریـستە بەڕێزانـەی لـە بـارەی هونەرمەنـد شـالووری کوردسـتان (مریەم خان) یان نووسیوە، کە لەسەر زاری ئەو هونەرمەندانەی کە لەگەڵی ژیاون و تۆماریان کـردووە، باسـی ژیـان و سـەربردەی خۆیـانی بـۆ کـردوون، ئینجـا نووسـەران لـە زاری ئـەو هونەرمەندانـەیان وەرگرتـووەو لـە گۆڤـار و ڕۆژنامـەکان و ئێزگـەکان بڵاویـان کردۆتـەوە، لـەم بارەیـەوە بـەڕێز (کـەمال ڕەئـووف محەمـەد) ڕۆڵێکـی بەرچاوی گێـڕاوە لەسـەردانی مەیـدانی و شەونخونی لە بارەی ئـەو هونەرمەنـدە، لـە ڕۆژنامـەی هاوکـاری ژمـارە (٥٠٢ لـە ١٩٧٩/١٢/٣ــ ٥٠٣ لە ١٩٧٩/١٢/١٠) دوو نووسینی لەگەڵ دوو وێنەی ئەم هونەرمەنـدەی بڵاوکردۆتـەوە، بـۆ ئـەوەی خـەڵك ئاشـنای دەنـگ و ئـاواز و سـەدای ئـەو ئافرەتـە هونەرمەنـد و چـڕین بێـژە ببـێ و هـەروا بـۆ ئـەوەی نووسـەران وەك سەرچاوەیەکی بـە سـوود بـۆ نووسـین و لێکۆڵینەوەکانیانـدا کەڵکی لێ وەربگرن.

ئەو نووسینانەی تا ئێستا لەسەر مریەم خانی هونەرمەندو ستران بێژ نووسراوە ئەمانەن:

١. مریـەم خـان کـچی (محەمـەد)ە، خـەڵکی جزیـرەی بۆتانـە لـە گونـدی (دێـر گـوڵ) لـە ساڵی١٩٠٤ لە دایك بووەو سەر بە قەزای (بێرتێ)یە لە کوردستانی باکووردا، بڕوانـە ڕۆژنامـەی هاوکـاری ژمـارە (٥٠٢ لـە ١٩٧٩/١٢/٣) نووسـینی (کـەمال ڕەئـووف محەمەد).
٢. هونەرمەند (مریەم خان) خەڵکی جزیرەی بۆتانە لە ساڵی١٩٠٤ لە گوندێکی سـەر بـە شـاری (نـسیبین) لـە دایـك بـووە، هـەروا ئـەڵێن (فەڵـە)یـە، بڕوانـە گۆڤـاری (الـتراث الشعبي) ئەیلولی ساڵی١٩٧١ نووسینی (ئەب یوسف سەعید).
٣. هونەرمەند (مریەم خان) خەڵکی جزیرەی بۆتانە لە گوندی دێر گوڵ لـە دایـك بـووەو سـەر بـە قـەزای (بێرتـێ)یـە، شـووی بـە ئەفـسەرێك کـردووە کـە لـە بنەماڵـەی بەدرخانیـەکان بـووە، بـەڵام لـە ئـەنجامی سـتران گـۆتن دەسـتی لـێ بـەرداوە.. بڕوانـە گۆڤاری (التراث الشعبي) ئەیلولی ساڵی١٩٧١ نووسینی (ئەب یوسف سەعید).
٤. واحیـد کـوڕی هونەرمەنـد عـەزیز ئاغـای قـەوان ئـەڵێ دایکـم (خەدیجـە خـان) دەیگێڕایەوەو دەیگوت: (مریەم خان) زۆر دۆستی عەزیز ئاغا بوو، زۆر جار مێوانی ئێمـە دەبـوو لـە هـەولێر .. باسـی دەکـرد کـە شـووی بـە ئەفسەرێك کـردووە کـە لـە

بنەماڵـەی بەدرخانییـەكان بـووە لـە شـەڕێكی كـوردان دژی عوسمانییـەكان شـەهید بووە.

٥. هونەرمەنـد (مریـەم خـان) لـە گونـدێكی دەشـتی (سلۆپی)یـە لـە ساڵی١٩٠٤ لـە دایـك بووە، بڕوانە ڕۆژنامەی هاوكاری ١٩٧٨/١٠/٣، (سەگڤان عەبدولحەكیم).

٦. هونەرمەنـد (مریـەم خـان) كرێكـار بـووە لـە گـەڵیێ زاخۆییێدا، هـەروا منـداڵی نـەبووە، بڕوانـە گۆڤـاری هاوكـاری ژمـارە ٥٠٢ لـە ١٩٧٣/١٢/٣، نووسـینی (كـەمال ڕەئـووف محەمەد).

٧. مریـەم خـان تووشـی نەخۆشـی (گورچیلە) بـووە لـە نەخۆشـخانەی (مـیر ئـەلیاس) نەشتەگەری بـۆ كـراوەو لەگـەڵ پزیـشكێكی (جـوو) بـە دەمـەقاڵ هـاتووەو پزیـشكەكە شەقێكی لێداوەو بۆتـە هـۆی مردنـی، هـەروا ئـەڵێن گوایـا پارەیـەكی زۆری لـە بانـك و لای خـەڵك هـەبووە، بـە تایبـەتی لـەلای (سـەبرییە) و ( ڕوشـدی عـەلی) پارەكـەیان خواردووەو پزیشكە جووەكەیان بە پارە ڕازی كردووە كە بیكوژێ، بڕوانـە گۆڤاری هاوكاری ژمارە ٥٠٢ لە ١٩٧٩/١٢/٣ نووسینی (كەمال رەئووف محەمەد).

٨. مریـەم خـان یەكـەم ئـافرەتی كـورد بـووە كـە بـە دیـالیكتی زاری كرمـانجی ژوورو لـە كۆمپانییاكـان گـۆرانی تۆمـار كـردووە، بڕوانـە گۆڤـاری هاوكـاری ژمـارە ٥٠٣ لـە ١٩٧٩/١٢/١٠، نووسینی (كەمال رەئووف محەمەد).

٩. هەروا هەڤاڵی بەڕێزم (ئیسماعیل بادی) نووسەر و فۆلكلۆریست، لێكۆڵینەوەیەكی تێر و تەسەڵ و بە پێزی دەربارەی (مریـەم خـان)ی تۆمار كردووە لە گۆڤاری دهـۆك ژمارە (٢) ساڵی١٩٨٨، سوودی لەسەرچاوە بڵاوكراوەكاندا وەرگرتووە.

١٠. نووســەر و فۆلكلۆریــست (شــەعبان مزیــری) لــە گۆڤــاری ڕەنگــین ژمــارە (١٥٤) ســاڵی٢٠٠١ دەربــارەی مریــەم خــانی نووســیوە ســوودی لــە هــەمان سەرچــاوەو بڵاوكراوەكاندا وەرگرتووە.

١١. هونەرمەند (باكوری) لە پەرتووكی (گۆرانی بێژە نەمرەكان)دا دەربارەی مریەم خـانی نووسیوە، سوودی لە سەرچاوەو بڵاوكراوەكاندا وەرگرتووە.

١٢. نووسەر فۆلكلۆریست (سەعید دێرەشی) لە گۆڤاری (هەلاڵـە) ژمارە ٤، ٥، بەمجۆرە دەربارەی مریەم خانی نووسیوە (مریەم خان و سترانا، وە لە دومام) باسی سترانەكە دەكاو لە لایەنی رامیارییەوە شیدەكاتەوە بێ ئەوەی باسی ژیانی بكات، ئەوەی من ئاگاداری بم، ئەمە پوختەی ئەو نووسینانەن كە لەسەر هونەرمەند شالووری كورد و كوردستان (مریەم خان) تۆمار كراون.

# مریەم خان (هەرکی)یە

١) بەپێی گەڕانی مەیدانی (جەلال مەلا حەسەن) بۆ گوندی دارەبەن بۆ لایی هەڤاڵی بەڕێز (مەلا عوبێد حاجی سەیدۆ) کە لە تیرەی (سمایلی)یە لە خێڵی هەرکی بەڕێزی گوتوویەتی کە مریەم خان (هەرکی)یە لە تیرەی (سمایلی)یە لەبنەماڵەی (ماڵە ڕەشە) ناوی تەواوی (مریەم میکایل میکایل)ە ناوی دایکی (مەرەزە).

٢) لە سەردانی جەلال مەلا حەسەن خۆشناو لەگەڵ جبرائیل میکایلەوە بۆ لایی (مەجید نوری ئاغا هەرکی)دا کە گوتوویەتی لە چلەکاندا ئەسعەد فەتاح ئاغای هەرکی سەردانی بەغدای کردووە، چاوی بە مریەم خان کەوتووە لەکاتی ئاخافتندا مریەم خان گوتوویەتی من هەرکیم لە تیرەی (مالە مەدم)، کە ئەسعەد ئاغا گەڕایەوە لە بەغدادا بە دایکی منی گوت خزمێکت لە بەغدایە گۆرانی بێژە، چونکە دایکی من لە هەمان تیرەیە.

٣) مامۆستا تایەر تۆفیقی گۆرانی بێژ قسەی لەگەڵ مریەم خان کردووە مریەم خان گوتوویەتی من هەرکیم.

# مریەم خان و فۆنەتیکی دەربڕینی زاراوەی هەرکی

پاش گەڕانێکی مەیدانی بۆ ساغکردنەوەی ئەو زاراوانەی کە مریەم خان بە کاری دەهێنێت لە لاوك و بەستەکانیدا ئەوە بوو چوومە لایی فۆلکلۆر پەروەر (جبرائیل میکایل میکایل) لە میانەی چاوپێکەوتنێکدا زۆر بە روونی ئەم بابەتەی شیکردەوەو چەند نموونەیەکی داینێ لە لاوك و بەستەکانیدا وەکو لەم خشتەیەی خوارەوە هاتووە:

| ژ | ناوی | ژ | ناوی |
|---|---|---|---|
| ١. | لێ دایێ | ٨. | چار دارا بابێ ئەمین گریدانە |
| ٢. | سبەیە باکی سارە | ٩. | دە دەنگێ تۆپا جەبل خانە |
| ٣. | لاوکی بابی کۆر ئۆغلی | ١٠. | دەهێ وەزی دیاری موشا شەوتی |
| ٤. | تو گولا مالا عەمری | ١١. | نزانم چما |
| ٥. | کاروانێ مالا بابێ سێڤێ | ١٢. | بێژن حاجی عەلی سێوێ ژ خورا برن |
| ٦. | پەریشانێ ب سێ دەنگا پەریخانێ دکر گازی | ١٣. | گولێ وەی نار وەی نار |
| ٧. | هێلی دەلال | | |

هەروەها لە ئەنجامی گەڕانی مەیدانی بۆ لای چەند هونەر دۆستێکی تردا وەك (شێخ زوبێر) لە موسڵ کاك (م.ح.ع) لە دهۆکدا، بۆمان دەردەکەوێت کەوا ئەو فۆنەتیکە دەربڕینەی کە لە لاوك و بەستەی مریەم خان دا هەیە یا:

١) کاریگەری ئەو ژیانەی بووە کە لە ناو هەرکیانی بەسەر بردووە.

٢) یاخود دیالیکتێکی سەرەکی مریەم خان بووە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا باسی بکەین ئەوەیە کە ئەو ئافرەتە دەنگ خۆشە رێچکەیەکی هونەری گەورەی هەبوو لە لاوك و بەستەی کوردی دا کە تێکەلاو بە رووباری هونەری گۆرانی و موزیکی کوردی دەبێتەوە، جا لێرەدا گرنگ نییە ئەم هونەرمەندە موڵکی کوردستانی باکوور بێت، یا خود باشوور، چونکە خزمەتێکی زۆری کردووە بە هونەری کوردی دا بۆیە بۆتە موڵکی هەموو تیر و هۆزێك لەهەر چوار پارچەی کوردستاندا بەبێ هیچ جیاوازییەکی ناوچەگەریانەدا.

# ڕوونكرنەوەیەك دەربارەی ئەم كتێبە

پاش ئەوەی فۆلكلۆر پەروەری كورد (جەلال مەلا حەسەن) كۆمەڵێك لە لاوك و بەستەی خاتوونی هونەرمەند (مریەم خان)ی كۆیكردەوەو ئامادەی كرد، بەڵام چەند بەرهەمێكی تر مابوو كەوا بینووسێتەوە كەچی لە هیچ شوێنێك دەست نە دەكەوت، ئەوە بوو ناو نیشانی پیاوێكی هونەر دۆستمان وەرگرت لە موسڵ كە گوایا زۆربەی قەوان و كاسێتی كۆنی لەلا دەست دەكەوێت، ئەمە بووە هۆی چەند جارێك بچین بۆ (موسڵ) بۆ ماڵی ئەو بەرێزە كە لە (حي نور) بوو بەڵام نەمان دۆزیەوە لەبەر باری ناتەواوی موسڵ كەس ماڵی كەسی نیشان نەدەدا، ئەمەش بووە تەگەرەیەكی زۆر گەورە بەرامبەر ئەم كارە، لە دوایی باری نا تەندروستی باوكم (جەلال مەلا حەسەن) بەسەر داهات و بووە هۆی كۆچی دوایی كردنی، بەمە كارەكە خۆی لە خۆیدا ڕاوەستا منیش بە ئەركی خۆم زانی كەوا كار لەم بابەتە پڕ بە پێزە بكەم و دەست بە گەڕانی مەیدانی بكەم بە دوای ئەم لاوك و بەستانەی تر كە ماون و ئەو ڕێبازە و ڕێچەكە پیرۆزەی باوكم بگرمەبەر.

پاش گەڕانێكی مەیدانی زۆر توانیم بەرهەمەكانی (مریەم خان) هەموو بە دەنگ پەیدا بكەم، لە ئاكرێ و شێخان و دهۆك و موسڵ بۆیە دەستم كرد بە تەواو كردنی كتێبەكەی مریەم خان بۆ ئەوەی زیاتر بابەتەكە دیاربێت كەوا مامۆستا (جەلال مەلا حەسەن) چەند كاری كردووەو جێگەی پەنجە و ماندوو بوونی دیار بێت بۆیە، لە شێوەی دوو بەش لە ناو كتێبێكدا بلاوی دەكەمەوە كە بەشی یەكەم (جەلال مەلا حەسەن) كاری تێدا كردوو، بەشی دووەم خۆم كارم تیا كردووە هیوادارم بە هەردووكمان خزمەتێكی بچووكی ئەم هونەرمەندەمان كردبێت.

(جەلال مەلا حەسەن لە دوای كۆچی دوایی خزمەتی مریەم خان دەكات)

لە كاتی گەڕانی مەیدانیمدا چوومە لای هونەر دۆستێك لە دەڤەری بادینان كە چەند لاوك و بەستەیەكی مریەم خانی لەلابوو، بەڵام بەرهەمەكانی نەدا پێم بە دەنگ كاری لێ بكەم و بینووسمەوە، بەڵام خۆشبەختانە ژمارەی تەلەفۆنەكەم پێدا وەكو یەكتر ناسینێك كە گەڕامەوە بۆ هەولێر بۆ ڕۆژی دوایی بەیانی زوو تەلەفۆنێك لێدرا كە وەڵامی تەلەفۆنەكەم داوە ئەم هونەر دۆستەی دەڤەری بادینان دەرچوو كە رۆژی پێشتر چووبوومە لای، گوتی دوێنێ شەو باوكت لە خەودا هاتبووە لام پێی گوتم ئەم لاوك و بەستانەت بۆ نەداوەتە كورەكەم بە دڵ شكاوی ڕەوانەی هەولێرت كردووە. لە ئەنجامدا لە هەمان ڕۆژدا چوومە لایی هاوكارییەكی لە لاوك و بەستەكانی مریەم خان دا زۆری كردم .

# بەستەکانی: مریەم خان

١. بەستەی: مێرەمێ.
٢. بەستەی: گول شێنی.
٣. بەستەی: لێ دینێ.
٤. بەستەی: قومریکێ.
٥. بەستەی: لێلێ وەسۆ.
٦. بەستەی:گرێ سیرا.
٧. بەستەی: گولێ وەی نار.
٨. بەستەی: چوومە دەریا دادایێ.
٩. بەستەی: کراسێتە کتانە.
١٠. بەستەی: بەردە، بەردە.

## *Mêremmê*

## میـــرەمیَ

mê re mm mê ------ re mmê wax lê gid yê mê------- re mmê

mê re mmê mê -------- re mmê tû lê cwa nê mê -------- re mmê

*D.C. al Fine*

میٚرەمیٚ، میٚرەمیٚ، واخ لیٚ گدییٚ میٚرەمیٚ
میٚرەمیٚ، میٚرەمیٚ، تۆلە جوانیٚ میٚرەمیٚ
بیکا شاهیٚ عەجەمیٚ، تەولیٚ گدییٚ و میٚرەمیٚ
بیکا شاهیٚ عەجەمیٚ، تۆلە جوانیٚ مریەمیٚ
مریەم تیٚتو چییٚدا، تەولیٚ گدییٚ و مریەمیٚ
مریەم تیٚتو چییٚدا، تۆلە جوانیٚ مریەمیٚ
قۆلانا زیٚرا گریٚدا، واخ لیٚ گدییٚ ومریەمیٚ
قۆلانا زیٚرا گریٚدا، تۆلە جوانیٚ مریەمیٚ
مریەم ل مالە و بابیٚدا، واخ لیٚ گدییٚ مریەمیٚ
مریەم ل مالە و بابیٚدا، ، تۆلە جوانیٚ مریەمیٚ
میٚرەمیٚ، میٚرەمیٚ، تەولیٚ گەدییٚ و مریەمیٚ
میٚرەمیٚ، میٚرەمیٚ، تۆلە جوانیٚ مریەمیٚ
مریەم هاتوو چیاییٚ، واخ لیٚ گدییٚ مریەمیٚ
مریەم هاتوو چیاییٚ، تۆلە جوانیٚ میٚرەمیٚ
قۆلانا زیٚرا گریٚدا، واخ لیٚ گدییٚ مریەمیٚ
قۆلانا زیٚرا گریٚدا، تۆلە جوانیٚ میٚرەمیٚ
مریەم ل مالیٚ دا مایی، واخ لیٚ گدییٚ مریەمیٚ
مریەم ل مالیٚ دا مایی، تەولیٚ گەدییٚ و میٚرەمیٚ
میٚرەمیٚ، میٚرەمیٚ، تۆلە جوانیٚ میٚرەمیٚ

# *Gul şênî*
## گــول شــێنی




گول شێنی، شێنی، شێنی، لیٚ گول شێنیا من مالا من
گول شێنی و شێنی و شێنی، گول شێنیا من مالا من
گول شێنی، دوونه، دوونه، گول شێنیا من عەمری من
گول شێنی و شێنی و شێنی، گول شێنیا من مالا من
هاتی رەزا داتێنە، لیٚ کورِ و کەچکی خەلکینە
گول شێنی و شێنی و شێنی، گول شێنیا من مالا من
گول شێنی، سێنە، سێنە، لیٚ گول شێنی و شینی و شێنی لۆ
گول شێنی و شێنی و شێنی، گول شێنیا من مالا من
هاتی رەزا داتێنە، لیٚ گول شێنیا من عەمرا من
کورِ و کەچکی خەلکینە، لیٚ گول شێنی و شێنی، شێنی وەی
گول شێنی و شێنی، شێنی، وەی گول شێنیا من مالا من

## *Lê dînê*

## لێ دیـــــــنێ




لێ دینێ، لێ دینێ، واخ لێ دینێ، لێلێ دینێ
لێ دینێ، لێ دینێ، تەو دینەو زالم دینێ
وەز دینا چیاکی سپیمە، ، واخ لێ دینێ، لێلێ دینێ
وەز دینا چیاکی سپیمە، دینێ و زالم دینێ
حەماعیلۆ ب ریشینە، واخ لێ دینێ، لێلێ دینێ
لێ دینێ، لێ دینێ، تەو دینەو زالم دینێ
دۆستا لاوکێ، کەیفیمە، واخ لێ دینێ، لێلێ دینێ
دۆستا لاوکێ، کەیفیمە، دینێ و زالم دینێ
لێ دینێ، لێ دینێ، تەو دینەو زالم دینێ
وەز دینا چیاکێ رەشم، واخ لێ دینێ، لێلێ دینێ
وەز دینا چیاکێ رەشم، تەو دینەو زالم دینێ
حەماعیلۆ بنەوشم، واخ لێ دینێ، لێلێ دینێ
حەماعیلۆ بنەوشم، دینێ و زالم دینێ
لێ دینێ، لێ دینێ، تەو دینەو زالم دینێ
وەز دینا چیاکی سۆرم، واخ لێ دینێ، لێلێ دینێ
وەز دینا چیاکی سۆرم، ، تەو دینەو زالم دینێ
حەماعیلۆ کا سۆرم، واخ لێ دینێ، لێلێ دینێ
حەماعیلۆ کا سۆرم، تەو دینەو زالم دینێ
لێ دینێ، لێ دینێ، واخ دینێ و زالم دینێ

# *Qumrîkê*
## قومـــريكیێ

qum rî--------- kê wez rû mî me bi lê de------- la lê--- wez

rû m î me------ qum rî -------- kê wez rû m î me biê

de-------- la lê we-- z rû----- mî me qum rî ---------- kî wez

rû mî---- ma bilê de --------- l a lê we-- z rû ------ mî me

*D.C. al Fine*

قومريكیێ وەز رۆميمە، بلیێ دەلالی وەز رۆميمە
قومريكیێ وەز رۆميمە، بلیێ دەلالی وەز رۆميمە
دەيار، يار، يار، دەيار، يار، يار، دەيار، يار، يار
دەيار، يار، دەيار، يار، يار، دەيار، يار، بیێ تە سەبرا من نايیێ
كوم سۆرو وەفەنديمە، بلیێ كوم سۆرو وەفەنديمە
خولام چاوێن، رەش بەلـەك، وەشقیێ كەچكا كەيفيمە
خولام چاڤين، رەش بەلـەك، ئاشقی كەچكا كەيفيمە
دەيار، يار، يار، دەيار، يار، يار، دەيار، يار، يار
دەيار، يار، دەيار، يار، يار، دەيار، يار، بێتە سەبرا من نايیێ
قومريك، سێڤا تجارا، بلیێ، دەلال، سێڤا تجارا
قومريك، سێڤا تجارا، بلیێ، دەلال، سێڤا تجارا
دەيار، يار، دەيار، يار، يار، دەيار، يار، بێتە سەبرا من نايیێ
دەيار، يار، دەيار، يار، يار، دەيار، يار، بێتە سەبرا من نايیێ
كە ڤوكا ل سەر منارا، بلیێ كە ڤوكا ل سەر منارا
حەيفە چاوێن رەش بەلـەك، كەتی دەستیێ نەيارا
حەيفە چاوێن رەش بەلـەك، كەتی دەستیێ نەيارا
دەيار، يار، يار، دەيار، يار، يار، دەيار، يار، يار
دەيار، يار، دەيار، يار، يار، دەيار، يار، بێتە سەبرا من نايیێ

# *Lê lê Wesso*
## لێ لێ وەســــــۆ




*D.C. al Fine*

لێلیێ وەسۆم، لیێ، لیێ، لیێ، وەسیلاێی م، وەی، وەی
لێلیێ وەسۆم، لیێ، لیێ، لیێ، وەسیلاێی م، وەی، وەی
لێلیێ وەسیێم، لیێ، لیێ، لیێ، وەسیلاێی م، وەی، وەی
لێلیێ وەسیێم، لیێ، لیێ، لیێ، وەسیلاێی م، وەی، وەی
تە پۆر سۆریێم، لیێ، لیێ، لیێ، حەنەدایێ م، وەی، وەی
تە پۆر سۆریێم، لیێ، لیێ، لیێ، حەنەدایێ م، وەی، وەی
تە پۆر سۆریێم، لیێ، لیێ، لیێ، حەنەدایێ م، وەی، وەی
تەشی رێسیێم، لیێ، لیێ، لیێ، چوو سەرایێ م، وەی، وەی
تەشی رێسیێم، لیێ، لیێ، لیێ، چوو سەرایێ م، وەی، وەی
تەشی رێسیێم، لیێ، لیێ، لیێ، چوو سەرایێ م، وەی، وەی
تەشی رێسیێم، لیێ، لیێ، لیێ، چوو بەغدایێ م، وەی، وەی
مالا وەسوم، لیێ، لیێ، لیێ، ژ مالا وێدام، وەی، وەی
مالا گەورێم، لیێ لیێ، ژ مالا وێدام، وەی، وەی
مالا وەسوم، لیێ، لیێ، لیێ، ژ مالا وێدام، وەی، وەی
مالا گەورێم، لیێ، لیێ، لیێ، ژ مالا وێدام، وەی، وەی
قرکا وەسۆم، لیێ، لیێ، لیێ، چل گەزازێدەم، وەی، وەی
قرکا وەسۆم، لیێ، لیێ، لیێ، چل گەزازێدەم، وەی، وەی
قرکا وەسۆم، لیێ، لیێ، لیێ، چل گەزازێدەم، وەی، وەی
قرکا وەسۆم، لیێ، لیێ، لیێ، چل گەزازێدەم، وەی، وەی

وەز رامووسم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، ل مالا با بیٚدا، وەی، وەی
وەز رامووسم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، ل مالا با بیٚدا، وەی، وەی
وەز رامووسم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، ل مالا با بیٚدا، وەی، وەی
وەز رامووسم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، ل مالا با بیٚدا، وەی، وەی
مالا وەسۆم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، ل تاخا ژووری م، وەی، وەی
مالا گەوریٚ م، لیٚ، لیٚ، لیٚ، ل تاخا ژووری م، وەی، وەی
مالا وەسۆم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، ل تاخا ژووری م، وەی، وەی
مالا گەوریٚ م، لیٚ، لیٚ، لیٚ، ل تاخا ژووری م، وەی، وەی
قرکا وەسۆم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، مەرجان و مۆری م، وەی، وەی
قرکا وەسۆم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، مەرجان و مۆری م، وەی، وەی
قرکا وەسۆم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، مەرجان و مۆری م، وەی، وەی
قرکا وەسۆم، لیٚ، لیٚ، لیٚ، مەرجان و مۆری م، وەی، وەی
مت، ڤیٚ رامووسم، لیٚ، لیٚ، لیٚ کەچکا تۆری م، وەی، وەی
مت، ڤیٚ رامووسم، لیٚ، لیٚ، لیٚ کەچکا تۆری م، وەی، وەی
مت، ڤیٚ رامووسم، لیٚ، لیٚ، لیٚ کەچکا تۆری م، وەی، وەی
مت، ڤیٚ رامووسم، لیٚ، لیٚ، لیٚ کەچکا تۆری م، وەی، وەی

## *girê sîra*
## گــرێ ســیرا




گرێ سیرا بە نیسکە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
گر خۆپانێ بە نیسکە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
گرێ سیرا بە نیسکە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
گر خۆپانێ بە نیسکە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
ڤا سوارا هیسکو هیسکە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
ڤا سوارا هیسکو هیسکە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
ڤا سوارا هیسکو هیسکە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
ڤا سوارا هیسکو هیسکە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم، لانیسکە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم، لالیسکە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم، لانیسکە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم، لالیسکە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
گرێ سیرا بەسیرە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ

گر خۆپانی، بەسیرە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
گرێ سیرا بەسیرە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
گر خۆپانی، بەسیرە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
ڤا سوارە، حیرو، حیرە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
ڤا سوارە، حیرو، حیرە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ

ڤا سواره، قیره، قیره، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
ڤا سواره، قیره، قیره، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم وەزیرەو، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم وەزیرەو، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم وەزیرەو، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم وەزیرەو، تۆلە جوانێ، مەیرۆ

گرێ سیرا به جەیەو، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
گر خوپانی به جەیەو، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
گر خوپانی به جەیەو، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
گر خوپانی به جەیەو، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
ڤا سوارا، هەیەو هەیە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
ڤا سوارا، هەیەو هەیە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
ڤا سوارا، هەیەو هەیە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
ڤا سوارا، هەیەو هەیە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم، فەلەیە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم، فەلەیە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم، فەلەیە، لێلێ، لێلێ، مەیرۆ
خوشکێ مەیرۆم، فەلەیە، تۆلە جوانێ، مەیرۆ

# *gulê wey nar*
## گــولێ وەی نــار




گولـێ، وەی نار، وەی نار، وەی نارێ، جانێ وەی نار، وەی نار، وەی ناری
گولـێ، وەی نار، وەی نار، وەی نارێ، جانێ وەی نار، وەی نار، وەی نارێ
گولـێ، مەمك سێنیا ساڤارێ، جانێ مەمك سێنیا، ساڤارێ
گولـێ، من چاڤێن بەلـەك خوارێ، جانێ تە چاڤێن بەلـەك خوارێ
گولـێ، وەی نار، وەی نار، وەی نارێ، جانێ وەی نار، وەی نار، وەی نارێ
گولـێ، من باژێردا مەیزێ کر، جانێ تەت باژێردا مەیزێ کر
گولـێ، من باژێردا مەیزێ کر، جانێ تەت باژێردا مەیزێ کر
گولـێ، شام قوتنی ل بەژنا خۆکر، جانێ شام قوتنی ل بەژنا خۆکر
گولـێ، شام قوتنی ل بەژنا خۆکر، جانێ شام قوتنی ل بەژنا خۆکر
گولێ یا من بوو، خودێ نەکر، جانێ یاتە بوو، خودێ نەکر
گولـێ، وەی نار، وەی نار، وەی نارێ، جانێ وەی نار، وەی نار، وەی نارێ
گولـێ، من باژێردا دنێری، جانێ تەت باژێردا دنێری
گولـێ، من باژێردا دنێری، جانێ تەت باژێردا دنێری
گولـێ، شام قوتنی ل بەژنێ کری، جانێ شام قوتنی ل بەژنێ کری
گولـێ، شام قوتنی ل بەژنێ کری، جانێ شام قوتنی ل بەژنێ کری
گولـێ، وەی نار، وەی نار، وەی نارێ، جانێ وەی نار، وەی نار، وەی نارێ

